# مەرجێن

# لا اله الا الله

## نه خئر بو هه مى خودايا به لئ بو اللّٰه

شلۆڤەکرنا بابەتی

مامۆستا کامەران کەریم

بانگە وازی
بو
تە وحیدێ

Bangawazi_bo_tawheed

< نافێ پەرتوکێ : مەرجێن لا اله الا الله

< شلوفەکرنا بابەتی : ماموستا کامەران

< نفیسینا بابەتی : بانگەوازی بو تەوحیدێ

## دەسپێک

**بسم الله والصلاة والسلام على اشرف الانبياء والمرسلين اما بعد.**

خودایێ مەزن د قورئانێ دا دبێژیت : (**فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ**)[1] زانا ره حمەتا خودێ لێبن دبێژن خودێ داخازێ ژ مه دکەت کو ئه م فێری (لا اله الا الله) ببین و ئه گه ر ته زانیاری ل سەرڤێ په یڤێ نه بن و تو بهێیه دناف ئیسلامێ دا و و تو نه زانی رامان ژێ چیه لوی دەمی تو نه هاتیه دناف ئیسلامێ دا ، و بەرێ خو بدەنێ خودێ دبێژیت (**فَاعْلَمْ**) ئه فه فعل امره ئانکو بزانه . چ بزانین یا الله ؟ (**أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ**) ب تەئکیت ناچێبیت گوهداریا چ کەسا بکەی و نا چێبیت عیبادەتێ چ که سا بکه ی اله الله و خودێ تعالا هه می قورئان ژ بەر ڤێ پەیڤێ یا ئینا یه خار و هه می پێغەمبەر و ژ بەر ڤێ پەیڤێ یێت هاتینه خار و هه می جن و ئینس ژ بەر ڤێ پەیڤێ یێت هاتینه دروست کرن.

فێجا لفێرێ دێ ئاماژەیێ بوێ چەندێ دەین کو گه لەک کەس هوسا یێت تێگەهشتین کو ئەگەر پێغەمبەر سلاف لسەر بن نەبایه خودێ دونیا دروست نەدکر و گەلەک جاران مه گولێ دبیت کو بومه حەدیسەکێ دئینن کو یا دروست کریه کو دبێژن پێغەمبەری سلاف لسەربن یا گوتی (لولاك ما خلقت الأفلاك)[2] و ئەف پەیفه ژ راستیان یا دیره و پێغەمبەری وەنه گوتیه ئانکو ئەگەر تو نەبای ئەی محمد من دونیا دروست نەدکر ! و هه می ژ بەر حەژێکرنا ته من یا دروست کری و ئەف ئاخفتنه یا خەله ته و هه ر قورئان بخو وێ رەدا وێ ئاخفتنێ دکەت هه روەکی خودێ دبێژیت :(**وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ**)[3] ئانکو ومن ئەجنه ومرۆڤ نەئافراندینه وپێغەمبەر بۆ وان نەهنارتینه ئەگه ر بەر ئارمانجەکا مەزن نەبت، کو ئەو پەرستنا من ب تنێ بکەن .و ئەگەر گوهداریا کەسەکێ کر کو مخالفی شەریعەتێ خودێ بیت و ته گوهداریا وی کر ئەو ته بخو کره دوو خودا ئه گه ر گوهداریا گەلەکا بکەن ئەو وه پەرستنا گەلەگ خودایا کر ، و هه روەکی فێکافێ ئەم دبینین گەلەک خودا یێت هەین . خوادایێ مەزن د قورئانێ دا بەحس لێ دکەت کو دەمێ پێغەمبەر سلاف لسەر بن چویه دەف قورەیشیان دیت کو یێ خودێ دپەرێسن و دگەل پەرستنا خودێ یێ چەندها تشتێن دی یێن دپەرێسن و قورەیشیان گوت :(**أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ**)[4] ئانکو چەوا محمد سلاف لسەربن دبێژیته مه کو دفێت تنێ پەرستنا خودێ بێته کرن و ناچێبیت پەرستنا چ تشتێن دی بکەین و ناچێبیت



1:سورة محمد اية :19

2:في "السلسلة الضعيفة" )282 : )موضوع اهـ

3:سورة الذاريات اية : 56 4:سورة ص اية :5

گوهداریا چ کەسا بکەین و دبێژیتە مە نا چێبێت ئەوا مە هەلبژاردی بخو بپەرێسین براستی ئەفە زور تشتەکێ عەجێبە !؟ و خودێ تعالا رەدا وان دا دڤێ ئایەتێ داو گوتی تنێ ئەو بو هندێ یێ هاتی کو دفێت خودێ بتنێ خودێ بیت نا چێبیت دگەل پەرستنا وی چ خودایێن دی هە بن.

و لفێرێ من دفێت بێمە خزمەتا هە وە و بەحسا مەرجێن (لا اله الا الله) و مەرجێن وێژی پێک دهێن هەشت مەرجان :﴿یاهاتیە سەلماندن کو کلیلا بەهشتێ پێکدهێت ژ گوتنا (لا اله الا الله) و بو چونا ژورا وی دەرگەهی یێ کو پێ دچیە بەهشتێ دفێت تە ئەو کلیل هەبیت و یا ئاشکەرا یە کو هەمی کلیلا ددان یێت هەین و ددانیت ڤێ گوتنا (لا اله الا الله) پێک دهێت ژ چەند مەرجەکان و یا پێتفیە کو تو وان مەرجان بکار بینی د ژیانا خو یا روژانە دا داکو دەرگەه بوتە فەبیت ئەگەر نە دەرگەه بوتە نا فەبیت ئەگەر تو کلیلێ ژی بکەیە دنافا دەرگەهی دا چونکی هەر کلیلەکێ ددانێت تایبەت هەنە﴾.

## مەرجێ ئێکێ زانین:

مەرجێ ئکێ یێ ڤێ (لا اله الا الله) فێت تو بزانی کو رامان ژێ چیە (لا اله الا الله) ئانکو چ خودێ نینن ژ هە ژی عیبادەتێ هیچ بەرەک هیچ دارەک هیچ بوچونەک هیچ فەلسەفە یەک هیچ رێبازەک هیچ داخازیەک ژ مریا و ژ ساخان ئە فە هە می نەد جائیزن و ناچێبیت ئیلە و بو الله نە بیت تنێ ئەوە یێ ژ هەژی پەرستنێ.

لا : نەفی ئانکو تو دبێژی نەخێر (لا اله) چ خودێ نینن هەژی عیبادەتێ ، ئەفە نەفیە ، و ئەگەر ئێک ڤێ بتنێ بێژیت و یا دی نە بێژیت و ئەو رامانا وێ بزانیت ئو دێ پێ کافر بیت ، بەلێ دفێت یادیژی دگەل بیت ئەوژی ئیثباتە (الا الله) ژبلی الله ئەو بتنێ یێ ژ هەژی عیبادەتێ.

(العلم المنافي للجهل) ئێکەم مەرج ئەوە کو خودێ ژتە قەبیل ناکەت بێ زانین هەروەکێ خودێ دبێژیت (**فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ**)[5] دفێت تە زانیاری هەبیت کو رامانا (لا اله الا الله) چیە بزمانێ کوردی ، زانا دبێژن (العلم بمعنا لا اله الا الله نفیا وأثباتا) لفێرێ دوو تشت تە کرن نەفی و ئیسبات ، ب کورتی تو دبێژی نەخێر بو هەمیان بەلێ بو خودێ.

لفێرێ ئەرێ واقعێ مە یێ هوسا یە کو نە خێر بو هەمی تشتا بەلێ بو خودێ ئە گەر تو بێژی بە لێ بو هەمیا نەخێر بو خودێ ، پشت راستەبە تو نە هاتیە دناف دینی دا .



5:سورة محمد اية :19

بەلگە لسەر ڤی مەرجی ب کورتی ئەڤ ئایەتە یە (**فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ**).

**مەرجێ دووێ الیقین:**

دڤێت تە باوەری هەبیت 100٪ و نا چێبیت ئێک شک و گومان د دلێ تە دا هەبیت ، شک و گومان تە ب ئاخیرەتێ هەبیت تو کافری، بلا تو پەرستنا خودێ ژی بکەی ئەگەر تە شک و گومان ل سەر دینێ ئیسلامێ هەبیت تو کافری، هەر وەکو تو دبێژی دێ دیف چم ئەگەر راست بو لوی دەمی ئەس دێ سەرفەراز بم و ئەگەر راست نەبو خو ئەس خسارەت نابم ، ئەڤ جورێ گومانێ ناچێبیت .

بەلکی دڤێت تو بێژی ئەس خودێ دپەرێسم و من باوەری پێ هەیە کو بەهشت و جەهنەم یێت هەین و خودێ تعالا دێ وی کەتە د ئاگریدا یێ گوهداریا وی نە کەت و دێ وی کەتە د بەهشتێ دا یێ گوهداریا وی بکەت ، و دڤێت یەقیناتە ئەڤە بیت.

الله تعالی د قورئانا پیرزدا دبێژیت : (**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا**)[6]

(**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ**) براستی ئیماندار ئەوە(**الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ**) باوەری ب خودێ و پێغمبەرێ وی هەی (**ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا**) و پاشی د باوەریا خودا دوو دل نابن.

ناچێبیت گومان د دلێ تە دا هەبیت ئەگەر گومان بوتە ژ دینێ ئیسلامێ چێبو ئەو بزانە تو نە چویە دناڤ ئیسلامێ دا . بەلکو دڤێت بێژی و د دلێ تە ژیدا باوەری هە بیت بو نمونە کاتو چەوا دبینی کو ئەو مێزەکە یان مروفە هوسا دڤێت تە باوەری هەبیت کو ئەڤ دینە یێ حەقە و بەهشت یا حەقە و جەهنەم یا حەقە

پشتی هینگێ دبێژیت :(**وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ**)[7] و ب مال وجانێ خۆ جیهاد د ڕێکا خودێ وڕازیبوونا وی دا کری، ئەو ئەون یێن ڕاستگۆ د باوەرییا خۆ دا .

**مەرجێ سێیێ الإخلاص:**

ئەوە دڤێت تو هەمی تشتا ژ بەر خودێ بکەی و نە ژ بەر چ مروفان ئەڤە یە دبێژنێ ئیخلاص (الإخلاص مناف للشرك) ناچێبیت تو شریکان پەیدا بکەی بەلکی دڤێت تو تەنها خودێ ب پەرێسی- دڤێت هەمی کار و کریارێت تە بو وی بن ، رامانا وێ ئەڤەیە کو دڤێت تو هەمی کار وکریارێن خو ب



6:سورة محمد اية :19

7:سورة الحجرات اية : 15

قوەت بکەی بو الله بتنێ (وحده لاشرك له) تو چ تشتا صەرف نەکەی بو خەیرێ خودێ دفێت نفێژێن تە بوخودێ بن روژی و زکات و حەج و دعا و نەزر و صەدەقە  دفێت هەمی تشتا تو بو خودێ بتنێ بکەی ئەگەر تە بو خەیری خودێ کرن تو موشریکی ئانکو ئەگەر تە تو خودێ ب پەرێسی و خەیری خودێ ژی ب پەرێسی هوسا خودێ ژتە قەبیل ناکەت.

خودێ تاعالا دبێژیت (**وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ**)[8] و د هەمی شریعەتان دا فەرمان ب تشتەکی ل وان نەهاتبوو کرن ژبلی هندێ کو ئەو پەرستنا خودێ ب تنێ بکەن ، و دفێت خو ژ شرکێ دیربێخن.

و دفێت هەمی عەمەل و کار ل سەر فێ عەقیدەیێ بن و هشیاربی شەفو روژ تە گول فان تشتان بیت نا چێبیت تو بي تاقەد بی چنکی ئەگەر تە ئەفە نەبیت هەمی کار و عەمەلێ تە یێ بەتالە چنکی هەمی پێغەمبەر یێت بوهندێ هاتین.

زانا دبێژن : ئەگەر ئەم بهێین و لێکولینا بکەین دبێژن ، ئێکەم تشت کو دفێت ئەم بزانین ، کو واجبترین واجب ئەفەیە کو تو بزانی کو مەرەم ژ دروست کرنا مە چیە ، پرسیار لفێرێ ئەرێ بوچ مەرەم ئەم دروست بوینە ؟ الله تعالا دبێژیت بو عیبادەتی ئانکو خو زەلیل کرن بەرامبەر خودێ تنێ مەرەم ژ دروست کرنا مە ئەفەیە ئەرێ پا چهێ مە لسەر فی عەردی بو چ مەرەمە ارێ بوچی ئەم ژ دوو دەیک و بابان بوین ارێ بوچی ئادەم هاتە خار ارێ بوچی خودێ ئادەم دروست کر ؟ و بوچی پێغەمبەر محمد (صل الله علیه وسلم) دروست بوی  و بوچی قورئان هاتیە خار بوچی مەلائیکەت هەنە ، هەمی ئەف تشتێن مە گوتین تنێ بو ئێک مەرەم یێت دروست بوین ئەوژی بو عیبادەتێ وی یێت دروست بوین نە زێدەتر.

ئانکو لفێرێ دفێت تو شەفو روژا عیبادەتێ وی بکە ی ئەگەر ئەف مەرجە دگەل نەبن هیچ عیبادەتێ تە نا هێتە وەرگرتن.

هین تەماشای مەلائیکە تان بکەن خودێ تعالا یێت دروست کرین، مەلائیکەتێن خودێ نێر و مێ نینن کچ و کور نینن وەکی مە هاوسەرگیریێ ناکەن و شەهوەت لدەف وان نینە ئێک ژ موسفاتێن وان خارن و فەخارن نینە خودێ تعالا هوسا یێت دروست کرین نەد خون نە فەدخون بەندەکێ ژ بەندەیێت خودێ ، ارێ پا بوچی خودێ دروست کرن ؟ ئێکەمین خال دفێت بزانین کو خودێ تعالا بەحسێ



8:سورة البينة اية : 5

وان دکەت قورئانێ دا و دبێژیت : (**يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ**)[9] شەف و روژ کارێ وان ئەوە تەسبیحا خودێ دکەن بێکو هیچ بێزاریەک لدەف پەیدا بیت .

تو بەرێ خو بدە ئیسرافیلی بوچی هاتیە دروست کرن کارێ وی ئەوە کو ل دەمێ دروست بونا وی حەتا روژا قیامەتێ یێ ل هیڤا الله تعالای کو ئەمری لێ بکەت کو پڤ کەتە بوقێ تنێ کارێ وی ئەڤە یە تنێ کارێ وی ئەڤە نەد واستیت نە بێزار دبیت نە ئاڤێ فەدخوت نە نانی دخوت نە ژنێ دهینت تنێ خودێ بو ڤێ چەندێ یێ دروست کری.

ڤێچا ئەڤ چندە بو مەلائیکەتان گەلەک یا سەیر بو کو خودێ تعالا گوت دێ مروڤان دروست کەم کو خوینێ برێژن و گونەهان بکەن و مەلائیکەتان گوتێ تو بو مە نا دانیە چهێ وان کو ئەم ب شەف روژ سبحان الله یا تە دکەین خودایێ مە ئەم تشتەکێ ناکەین ژبلی عیبادەتێ تە . خودێ تعالا گوت من حیکمەتا خو یا بو ڤی کاری هەی و هین نزانن ئەوا ئەز دزانم هین نزانن ، و خودێ تعالا ئەم مروف دروست کرین و ئەم دانانینە ل سەر ڤی عەردی و بارا پترا مە بو لایێ شەیطانی یێت چوین ، و خودێ تعالا گوت : شەیطان دوژمنێ وەیە و بخو بکەنە دوژمن چنکی چونکی شەیطانی دڤێت حیزبا خو بەرەڤ جەهنەمێ ببەت . و نوکە بارا پترا خەلکی لدیف دجن دڤێت خو بپارێزین ژ شەیطانی چنکی هەر ئەو بو بابێ مە ئادەم ژ بەحشتێ دەرێخست ب کەلیمەکێ و واس واسەیەکێ ! خو شەیطان بو نە جو دناڤا بەهشتێ دا تنێ برێکا واسواسەکێ د دلێ ئادەمی دا ئادەم د سەردا بر و خودێ ژ بەحشتێ دەرێخستن ، خو شەیطان نا هێتە بەر سینگێ تە و تو بێژی هە ردەمێ ئەز شەیطانی ببینم دێ کوژم نە خێر بەلکی شەیطان دهێتە ناڤ دلێ تە دا و دبێژیتە تە خرابیا بکە شرکێ بکە کوفرێ بکە مەعصیەتا خودێ بکە بیدعا بکە گونەها بکە زینایێ بکە ئارەقێ فەخو هە ر جورێ خرابیێ دبێژیتە تە بکە و ل بەر دلێ تە شرین دکەت و دوژی دجی گوهداریا وی دکەی و ئەڤەژی د بیتە عیبادەتا شەیطانی. الله تعالا دبێژیت :(**أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ ۖ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ**)[10] من نەگوتە هە ئەی زاروکێن ئادەمی شەیطانی نە پەرێسن چونکی ئەو دژمنێ هەوەیە ! (**وَأَنِ اعْبُدُونِي ۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ**)[11] گوهداریا من بکە ئەڤە یە رێکا راست.

ئەڤرو زوربەیا مروڤان لدیف رێبازا شەیطانی یێت کەتین ئەگەر ئەم بەرێ خو بدەینێ کو چەند کەس لسەر عەردی دژین دێ بێژن ٧ ملیار و نیڤن و دێ بێژین ملیارەکو نیڤ مسلمانن ئەو ژی بتنێ بناڤ مسلمانن ! ئەگەر بەرێ خو بدەینێ ٦ملیار مروف کافرن ل سەر رویێ عەردی . ئانکو بارا پتر ژ خەلکی دگەل شەیطانی دا یە نە دگەل رەحمانیدا.



9:سورة االنبياء اية : 20

10:سورة يس اية :60

11:سورة يس اية :61

الله تعالا دبێژیت : بارا پتریا خەلکی فاسقن :(**وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ**)[12] و دبێژیت :(**وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ**)[13] بارا پتر ژوان باوەریێ دئینن موشریکن ،! چونکی باوەری ب خودێ یا هەی بەس عیبادەتێ بو هندەک کەسێن دی ژی دکەن و خودێ تعالا دبێژیت : پەرستنا من دکەی و روژیا بو دگری و حەجێ بو من دکەی و صەدەقا ژی بو من ددەی بەس شە یطانی و مروف و جن و دار و بەر یاسایێت دەست کردت د پەرستی ئەفەیە پەرستنا گوهداری کرنێ ، دەمێ تو بروژی دبی ئەفە عیبادەتە بو خودێ ئە گەر گوهداریا خودێ بکەی ئەفە عیبادەتە بو خودێ فێجا فی عیبادەتی پیچ نە کە دەمێ تو دچیە سەر قەبرەکێ نە بێژی یا عبدلقادر و یا رسول الله هەوار یانژی رازیبی ب حوکمەکێ ژ خەیرێ حوکمێ خودێ ، چونکی هەمی عیبادەت تاقیکرنن بوتە دەمێ تو عیبادەتی دکەی ئانکو گوهداریا خودێ دکەی ئاگەر تە گوهداریا کەسە کێ دی کر ئەو تە عیبادەتا وی کەسی کر ئەگەر ئاخفتنا وی کەسی پێجەوانەی ئاخفتنا خودێ بیت لوی دەمی تە عیبادەتێ وی کەسی کر . ئەگەر تو وە بکەی و گوهداریا کەسە کی بکەی کو ئەو کەسە گوتن و کریارێت وی پێچەوانەی شەریعەتێ خودێ بن لوی دەمی عیبادەتێ تە بەتاڵ بو و ئەفە دبیتە شرک ئەگەر خو تو نفێژ و روژیا ژی بگری فایدە ناکەت لوی دەمی هەمی کارێ تە بێ فایدە چو.

خودێ تعالا دبێژیت :(**وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا**)[14] وئەم هاتینە وی کارێ وان کری یێ ب سەرڤە باش، ومە ئەو هەمی پویچکر، ووەکی تۆزا هویر وبەلاڤکری لێکر، ئەو چو مفای ژێ نابینن.

ئەفەیە شریک پەیدا کرن ، شریک پەیداکرن د عیبادەتی دا و شریک پەیداکرن د حوکمرانیێ دا ئەفە شرکە دفێت تو بەس ب حوکمرانیا الله رازی بی ئەگەر هاتو تو ب خەیری حوکمرانیا خودێ رازی بوی ب تەئکید تو موشریکی ئانکو تە حوکمرانیەک دگەل حوکمێ خودێ پەیدا کر ئەو ژی حوکمێ دەست کرد یێ مروفان دروس کری ، هەروەکی خودێ دبێژیت :(**وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا**)[15] ئانکو ب هیچ شێوەیەکی نا چێبیت د حوکمرانیا الله دا شریکان پەیدا بکەی هەر وەکی د ریوایەتە کادی دا هاتی (**ولا تشرك**) ئانکو تو شریکان پەیدا نەکە د حوکمرانیا خودێ دا.

خودێ تعالا دبێژیت دفێت تو دەستێ دزی ببری فێت تو ببری ئەگەر تە گوت ئەم نا برین دێ کەینە د سجنێ فە تو موشریکی چونکی تە ئاخفتنا خودێ رەد کر و ئاخفتنا خو ب سەرئێخست و ئە گەر تو هزار جاران بێژیە خو مسلمان خودێ ژتە قەبیل ناکەت ، الله تعالا دبێژیت دفێت تو عارەق فخوری



12:سورة ال عمران اية :111

13:سورة يوسف اية :106

14:سورة الفرقان اية :23 15:سورة الكهف اية : 26

جەلدە بدەی تو بێژی نەخێر وی عافیەت بیت ئازادیە ، تو موشریکی چونکی ئاخفتنا خودێ تە رەد کر و تە ئاخفتنا خو بسەر ئاخفتنا خودێ ئێخست تو موشرکی.

نوکە خودێ تعالا ئاسمانی شەق بکەت و بێژیتە مە تو حوکمرانی و تو حوکمرانی و هەروەسا توژی حوکمرانی ! دێ وەرە مام حاجی الله تعالا دبێژیتە تە وەرە بەندەیێ من ئەگەر کەسەکی زنا کر و کچ بوو ۱۰۰ جەلدا لێبدە و ئەگەر ژن بو رەجم بکە ، دێ بێژی دێ چەوا وەکەم والله ئەز وەناکەم ! ئەز دێ چم سجن کەم ، و دێ بێژیت کێشە نینە ! نەخێر بەلکو شەیطانی گوهداریا خودێ نەکر خودێ گوتێ سوجدێ ببە گوتی ئەز نابەم خودێ گوتێ تو کافری گوتێ هەرە دەرکەفە و شەیطانی چەندەهان عیبادەت هەبون ! گوتێ بکە گوتی ناکەم گوتێ تو کافری (**أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ**)[16] بزانە کو کافر چیە زور گرینگە ئەف خالە .

کافر هەر ئەو نینە یێ خەبەر و ئاخفتنێت کرێت بێژیتە خودێ و پێغەمبەرێ وی (صلى الله عليه وسلم) نوقتە و خالێن کافربونێ زانایێن ئیسلامێ د ناف کتێبێن فقهیدا (باب الرد) نێزیکی ٤٠٠ خالا و زێدەتر بەحسلێ دکەن کو ب فلان کاری یان ب فلان کەلیمێ تو دێ پێ کافر بی و دفێت ئەم د هشیار بین و بترسین ژفان کەلیمان ، الله تعالا مەرجان د دانتە بەرمە و دبێژیتە مە ناچێبیت د عیبادەتی دا تو شریکان پەیدا بکەی ناچێبیت تو د حوکمرانیێ دا شریکان پەیدا بکەی ناچێبیت ئاخفتنا کەسێ ل سەر ئاخفتنا خودێ بێخی و نابیت ئەم خو ب فروشینە چ کەسان دفێت تنێ خو ب فروشینە خودێ بتنێ .

**مەرجێ چارێ الصدق:**

الله تعالا دبێژیت :(**الم (١) أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ**)[17] ئەرێ مرۆڤان هزرکرییە کو ئەگەر وان گۆت: مە باوەری ئینا، خودێ بێ جەڕباندن دێ وان هێلت؟ (**وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ**)[18]

و ب ڕاستی ئەو مللەتێن بەری وان یێن مە پێغەمبەر بۆ هنارتین مە جەڕباند بوون، ڤێجا ب ڕاستی خودێ دێ وان ناست یێن د باوەرییا خۆ دا دڕاست، ویێن د باوەرییا خۆ دا ددرەوین.



16:سورة البقرة اية : 34

17:سورة العنكبوت اية : 1-2

18:سورة العنكبوت اية : 3

و ئەف خاله بەحسێ صیدق دکەت دفێت تو یێ راست بی دگەل (**لا اله الا الله**) و دفێت تو درەوان نەکەی مونافیق نەبی ژ نافدا یا تە تە گەرب و کین ژ خودێ و پێغەمبەرێ وی هەبن (**صلی الله علیه وسلم**) و ژدەرفە تو بچی دگەل موسلمانان رینیە خار و بێژی ئەز مسلمانم دفێت ژ نافدا یا تە و سەرفە یا تە نەفسی ئێکبن.

**مەرجێ پێنجێ المحبه:**

دفێت تو حەژێ بکەی و هەر تشتێ دنافا فێ (**لا اله الا الله**) دادفێت حەژێ بکەی تو حەژ خودێ و پێغەمبەرێ خودێ بکەی (**صلی الله علیه وسلم**) و هە رکەسەکێ ل دیف رێبازا ئیسلامێ دهێن چ ل عەسمانان بن یا ل عەردی دفێت حەژێ بکەی و هەر تشتەکێ پەیوەندی ب الله فەهەبیت دفێت تو حەژێ بکەی و ئەگەر تو حەژێ نەکەی تو کافری . تو حەژ مسلمانەکێ نە کەی تو کافری ژبەر بەر ئیسلامەتیا وی نە ژ بەرکو ئەخلاقێ وی نە یێ جانە تو حەژێ نەکەی ، من کەرب یا ژ موسلمانەکێ هەی چونکی درەوان دکەت تنێ من کەرب یا ژ درەوا وی هەی چونکی دروا دکەت بەلێ پا ئەز حەژێ دکەم ژبەر ئیمانا وی.

بەرێ خو بدەنێ یەهودی دبێژن وەکی د حەدیسێ دا ژی هاتی کو کەرب یا ژ جوبریل هەی و خودێ گوت هەرکەسەکێ کەرب ژ جوبریل هەبن کافرە (**فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ**)[19] تو بێژی ئەز حەژ خودێ و پێغەمبەرێ خودێ دکەم (صلی الله علیه وسلم) و نفێژ و عیبادەتێ بو دکەم و بێژی دێ خوینا خو ل سەر ئیسلامێ رێژم و تو بەس بێژی ئەز حەژ جوبریل ناکەی خودێ دبێژیت : تو کافری بو جەهەنەم هیچ دەمەکی ناهێیە دەرێ.

خودێ تعالا بەحسێ فێ حەژێکرنێ یا کری و دبێژیت :(**وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا**)[20] هندەك مرۆڤ ژبلی خودێ هەنە صەنەمان بۆ خودێ دکەنە هەڤتا (**يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ**)[21] بەرێ خو بدەنێ هەرکەسە کێ کا چەند حەژ خودێ بکەت هند حەژ کەسەکی بکەت ئێکسەر خودێ کرە موشریک چونکی تە ئەو کەسە ئینا رێزا خودێ ئەگەر بابێ تە بیت ان دیکاتە بیت سەرکردەک بیت دار بیت بەر بیت سنور بیت حەتا ئەگەر تو بێژی ئەز پتر حەژ پێغەمبەری دکەم ژ خودێ ئان



19:سورة ال عمران اية : 32

20-21:سورة البقره اية : 165

هندی حەژێکرنا خودێ لوی دەمی تو کافری . ناچێبیت هوسا بیت بەکو ئەصلێ هەمی تشـتان الله تعالا یه ئەز ژ بەر الله تعالا حەژ پێغەمبەری دکەم (صلی الله علیه وسلم) نه کو ژبەر پێغەمبەری حەژ خودێ بکەم !

دفێت تو هشیار بی کو پێغەمبەرێ خودێ مەخلوقه و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئینسانه خالق و ئیلاھ نینه و ئەر و ئەسماندروست نەکرینه ئەگەر خودێ پێغەمبەر (صلی الله علی وسلم) دروست نەکربایه ارێ ئەم دا پێغەمبەر (صلی الله علی وسلم) نیاسین ؟! نەخێر چونکی تنێ ئینسانەکه. بەس خودێ تعالا ئەو کره پێغەمبەر وگوته مه دفێت هین حەژی بکەن ئەگەر حەژێ نەکەن هین کافرن. بەرێ خو بدێ گەلەک کەس دبێژن خودێ و پێغەمبەرێ وی دزنن . ناجێبیت تو فێ ئاخفتنێ بێژی ناچێبیت تو پێغەمبەری (صلی الله علی وسلم) بینیه بەرامبەر خودێ د زانینێدا چونکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نه مایه د ژیانێ دا حەتاکو بزانیت و وەحی بو بهێت . دێ تشتەک چێبیت دنافا ته و هەفالالێ ته دێ هەفالێ ته بێژیت خودێ و پێغەمبەری وی دزانن و ئەف ئاخفتنه ل سەردەمێ صەحابەیان یا هاتیه گوت ل دەمێ پرسیار ژ صەحابەیان دکر دا بێژن (الله ورسول أعلم) بەس ئەفه لدەمەکی بو کو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یێ ساخ بو بەس ئەگە نوکه تشتەک ناف بەینا من و هەفالەکێ من چێببیت و ئەز بێژم خودێ و پێغەمبەر دزان ئەو من پێغەمبەر کره شریک دگەل خودێ د زانینا غەیبێدا . بەلکو تنێ خودێ تعالا خەیبێ دزایت (**قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ**)[22] تنێ الله خەیبێ دزانیت. ئانکو دفێت ئاگەهداربین کو الله لسەر هەمی تشتا یه نا چێبیت بێژی پێغەمبەر .

و(**وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ**)[23] هندیکه ئیماندارن ژ هەمی تشتان پتر حەش خودێ دکەن . ئەز دێ پرسیارەکێ کەم ئەرێ نوکه هوسایه ؟ الله تعالا دبێژیته ته گوهداریا من بکه بەس تو گوهداریا وی ناکەی بەلێ ل دەمی سەرکردەك بێژیته گوهداریا من بکه دێ بلەز چی و هەردوو ملێت خو بو شکێنی ژ خودێ پتر حەش وی سەرکردەی دکەت ، الله تعالا دبێژیته مه درێکا من دا شەری بکه دێ بێژن ئەفه بکێر مه ناهێت و ئەگەر سەرکردەیەک بێژیته وان دێ چیت ، وه هەمیا شەرێ عیراق و ئیرانێ ل بیر مایه کو ٨سالان ئەو شەر بەردەوام بو ئەو هە؟ی خەلکه دنافا وێ ترس و لەرزێ دا بو و هەما گوهداریا صەدام و خومەینی دکر و ئەو هەمی شەر وک وشتن درێکا سەرکردەیان دا کیفه چو و نەتیجێ وان کا تنێ مال خراب کرن بو ، و ئەگەر الله تعالا بهێت و بێژیته وه وەرن د رێکا من دا شەری بکەن دێ بینی کو رێژەکا گەلەک کێم دێ چن ئەوژی بەس حودێ دزانیت. نەخێر بو الله



22:سورة النمل اية : 65

23:سورة البقره اية : 165

نابیت بو الله خرابە بڤەیە بەس هەر سەرکردەیەك ئەمریکا نوکە بێژیت ئەم دێ هێزەکێ دروست کەین و هەیفانە دێ هندە دولاران دەینە تە دێ بینی دێ ملێن خو بو شکێن و دێ چن بەس خودێ تعالا دبێژیتە وان درێکا من دا شەری بکەن ئەزدێ بەهشتا حەتا حەتایێ دەمێ دێ بێژیت نەخێر ئەفە بڤەیە بکێر مە ناهێت ئێ قوران هەمی بەحسێ هندێ دکەت . ارێ حەژێکرنا الله ل سەر حەژێکرنا ئەوروپا و ئەمریکا بو ! نەخێر. دێ بێژێ تو دنافا منەزمەیەکێ کار دکەی و ئە فە هەوالگیریە ل سەر مسلمانان دێ بێژیت پەیوەندیا من پێفە چیە تنێ ئەز بو پارێ خو دچم هە رە جاسوسیێ بکە ل سەر مسلمانان دا پارە بگەهنە تە هەی خولی بسەرێ تە وەر ببیت خو هە می تشت پارە نینن.

ئانکو دفێت تو ژ هەمی تشتان پتر حەش خودێ بکەی و کەرب و کین بەرامبەر شەیطان و ئەولیائێن شەیطانی فەبن و ئەگەر تو حەش شەیطان و ئەولیائێن شەیطانی بکەی تو کافری. بەلام د نوکە دا رێز و حورمت ل شەیطان پەرێستان دهێتە گرتن.

ئەز تێناگەم تو بەس هزر بکە ارێ شەیطان یێ پیسە ان پاقژە ؟! ئەی مسلمان بو چی وەل مە هاتیە کو دفێت رێزێ ل شەیطان پەرێسان بگرین ئە فە چ زەلیلیە بسەرێ مە هاتی دێ بێژی (**اعوذ بالله من الشیطان الرجیم**) ماموستایێ ئاینی یێ هەی دێ بیت ئەگەر تو چویە بەرامبەر شەیطان پەرێسەکێ هەستێ وی نەشکێنە و نەبێژە (**اعوذ بالله من الشیطان الرجیم**) هەی چەپەل الله تعالا دبێژیت : (**فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ ۖ** )[24] توژی دبێژی ل بەر سینگێ شەیطان پەرێسەکی نەبێژە (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) توب خودێ ئافە نە سەرئالوز کرنە . والله ماموستایێ ئاینی هەبو قورئان د خاند رینشتنەکێ دا گوتی (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) ناخوینین دا برایێن مە یێت شەیطان پەرێس خەمگین نەبن ! ئێ هەی کافر ژڤێ زێدە تر ما!.

الله تعالا دبێژیت : (**إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ**)[25] هندی شەیتانە بۆ مرۆڤان دوژمنە، ڤێجا هوین ژی وی ب دوژمن بۆ خۆ بزانن وگوهداریيا وی نەکەن، هەما ئەو دویکەفتییێن خۆ بۆ بەرزەبوونێ گازی دکەت، دا ئەو ببنە ژ خەلکێ ئاگری. ئانکو دفێت ئەم رێزێ ل حیزبا جەهنەمیان بگرین ! ئەفە چ زەلیلیە ئەم تێدا ئەی هەوار مەلایێ ئاینی دێ هێتە دانان نەصرانی دێ هێتە دانان شەیطان پەرێس دێ هێتە دانان دفێت رێزێ ل هەمیان بگرین والله کافر دبیت ئەو کەسی وەبکەت ئەفە نەصی ئایەتا قورئانێ یە فێجا ئاکەهداربن .



24:سورة فصلت اية : 36

25:سورة فاطر اية : 6

**مەرجێ شەشێ الانقیاد:**

و (الانقیاد منادی الترك) ئینقیا ئانكو گوهداری كرن سمع و تاعەی بكەی منقاد بی چەوا تە بەرەف خوفه ببەت بێژی باشه ، تەشبیهـ نەبی حەیوانەک دەمێ کو حێشترکێ تو وەریسەکی دکەیه ملێ وی و ل دیف خو دکێشی د لدیف تە هێت ان نە !؟ کا چەوا ئەو دگەل تە دهێت بلا تشبیهـ دفێت توژی هوسا دگەل فەرمانێت خودێ دا بیت بێهیرفه و وێفه ، ئەگەر گوتی وەرە تو بێژی ناهێم خلاس حسابا تە چو دفێت تو یێ هوسا نە بی دفێت بچی و بێژی سەرچافان و ناچیبیت تەركا وان بكەی (ان تعبدوا الله وحده والاتنقاد للشرعة وتؤمن بها وتحتقید انها الحق) برا خو ئێک لا بکە بکە ئەگەر مسلمانی گوهداریا وی بگە ئەگەر مسلمان نینی بێژە تەواو مسلمان نینم.

دێ تسلیم بی دێ بێژیت بەلێ پادێ گوهداریا وی بكە ، هەر هند یال سەرتە ئەگەر تشتەکێ نەزانی بێژی من فێر بکەن نەکو معارەزێ بكەی .، معازەرێ نەكە . الله تعالا دبێژیت :(**وَأَنِيبُوا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ**)[26] بزفرن بو لایێ خودێ و تسلیم ببن، ئەفە خودێ د قورئانێ دا دبێژیت : وەرن تسلیم ببن دا تسلیمی وی ببین دا بزانین کا چ دبێژت ، وەرە قورئانێ بخوینه وەرە حەدیسێن پێغەمبەرێ وی بخوینه (صلی الله علیه وسلم) دا بزانی کا چ دبێژیت.

**مەرجێ حەفتێ القبول:**

دفێت تو قەبیل بكەی هەر تشتێ گوتی دەمێ دبێژیت دێ وەل خەلكی كەم و من بەهشت هوسا یا دروست کری و جەهنەم هوسا یا دروست کری و هوسا چێبیت دفێت بێژی هەمی راستن و من قەبیلە و پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) چ گوتیە حەدیس یا سحیح بیت دفێت تو قەبیل كەی و رەد نەکەی.

بەرێ خوبدەنە موشریکێن مەکەهێ الله د پەرست و دگەل الله خلک ژی دپەرست چەند تشتک بو وان دانان و خودێ تاقیکرن ئێک ژ وان تاقیکرنا ئەو دارا دناف جەهنەمێ دا وە هەمیا گوهل دارا



26:سورة الزمر اية : 54

زەقومێ نەبویە ئەوا دنافا جەهنەمێ دا خودێ تعالا بوچی بەحس لێ دکەت تنێ بو تاقیکرنێیە ، دبێژن کافران ترانە بخو ب پێغەمبەری (صلى الله علیه وسلم) کرن و کافران د گوت ئەرێ دێ چەوا جێبیت جەهنەم هندا گەرم گەرم و ئەو دارە دنافدا تەحملێ بکەت ! بێ عاقل ئەگەر خودێ گوت (کن فیکون) چەوا تەحەمولێ ناکەت ارێ والله دێ تەحەمولێ کەت کا چەوا ئیبراهیم (علیه السلام) فیابا سوت با دنافا ئاگریدا بەس نەهاتە سوتن ، خودێ جل و علایە دەسهەلاتا فی سەری و سەری دی یا هەی ، کافران گوت توب خودێ تشتێ هوسا جێدبیت مە شنی زانی کو پێغەمبەر یێ دینە !کو دبێژیت دارەک د جەهنەمێ دا هەیە ! و بخو پێ کرە کەنی ! و خودێ تعالٚا دبێژیت :( **إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ (٤٣) طَعَامُ الْأَثِيمِ (٤٤) كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ (٤٥) كَغَلْيِ الْحَمِيمِ**)[27] الله تعالا مەپارێزیت دفێت ئەم مسلمان بخو بکەینە گری ، بەردەوام تو ل نافا جەهنەمێ دای و ج لبەر دەستێ تە دایە ئافا سار ! نەخێر بەلکو ئافا گەرم خارنا خوش ! نەخێر بەلکی زەقوم دبێژیت دەمێ دهێتە خارن د نافا حەفکا مروفیدا ناچیتە خار خودێ تعالا ئەمر دا و خلاس ، قورەیشیێن کافرە کرە کنی گوت چەوا چێدبیت دار ل نافا جەهنەمێ هەبیت ئەفە ژی هەمی عاقلێ مروفانە.

پێغەمبەری (صلى الله علیه وسلم) گوت : دەمێ ئەز چویمە اسرا و میعراج دیسان قورەیشیان بمن کرە کەنی و گوتی یا ئەبو بکر وەرە هەفالێ تە یێ دین یێت بێژیت هەر ئەف شەفە اس ژ مەکەهێ فریم و چومە بیت المقدیس کرو ئەم ژفێرێ بو بیت المقدیس هەیفەکێ دچین و هەیفەکێ دهێنە فە و هەفالێ تە یێت بێژیت ئەس ئەف شەف چومە بیت المقدیس و عەسمانی و هاتمە فە . باشە ئەز دێ بێژمە هەوە دفێت ئەفە بچیتە د عاقلێ مروفی دا ئان دفێت مروف تسلیم بیت بو الله ی ! عاقلێ وان کافران ژڤێ چەندێ نەبری و باوەر ژێ نەکر بەلێ ئەم مسلمان ناچێبیت د هوسا بین دفێت ئەم باوەر بکەین ودفێت بچیتە د عاقلێ مەدا و وێ چەندێ ب راستی بزانینن. تو الله پەرست بەرێ خو بدە بەهشتێ تە ئیمان ب بەهشتەکێ هە کو دبێژن کو بەهشت هەتا هەتا یە ئافا وێ گەنی نابیت و درێت وێ کرمی نابیت و تریێ وێ نا رزیت و ئەو مروفێن دناف دا پیر نابن و نامرن و نساخ نابن و هیچ کەس نابێژتێ وەنەکە و وەنە بێژە و بو هەتا هەتایێ دی مینیتە تێدا ارێ دفێت بچیتە د عەقلێ مە دا !؟ ئەفە الله تعالا یێ دروست کرین ارێ تە باوەری پێ هەیە.

ارێ تە باوەری ب خودایەکی هەیە کو تە نەدیت بیت و تو عیبادەتێ بو وی دکەی و تە ئەو نەدیتییە و قورئان یا بومە فرێکری .، فێجا بوچی تو دێ ئیمانا خو ژ دەست دەی و لدیف ئینسانەکی کەفی کو هەفدژی فەرمانێت خودێ دکەت فێجا تو خو بکە بەندەیێ خودێ خو نە کە بەندەیێ چ کەسان ئەگە



[27] سورة الدخان اية : 45-44-43

نە تو موشریکی بەلکو تنێ بەندایەتیێ بو الله بکە فێجا دفێت تو قەبول بکەی فان ئایەتو حەدیسان ، ئەگەر بێنەسەر بەحسێ مەلائیکەتان دێ بێن نا نفن نەد خون ئەفە دێ چیتە د عاقلێ مە دا نەخێر بەلێ دفێت ئەم قەبیل بکەین و براستی بدانیت.

نوکە کەلەک کەس هەنە ب تایبەتی دختور باوەر ب هەبونا ئەجنەیان نینە دێ بێژن برا ئەو یێ توشی سەرعێ بوی ئەجنیەیان دەست یێ ژێ بەردای ب نەصی قورئان حەیسێ هندەک یێت هەین دێ بن ژن من باوەری نینە بچنە دناف لەشیدا و هندەک ژی یێت هەین هەما باوەری ب هەبونا وان نینە و خودێ تعالا سورەتەک بناڤێ (الجن) یا فرێکری الله تعالا دبێژیت (**وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ**)[28] ودێ بێژیت من باوەری ب ئەجنەیا نینە ! ئێ تو کافری و خلاس تو خو ب مسلمان ژی دزانی ئەفە کافرە دفێت سەرێ وی بهێتە هەرشاندن ئەگەر حوکمێ ئیسلامێ هەبیت نکە ئەو لدەف خو دکتورە ژی !

الله تعالا دبێژیت : (**إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ (٣٥) وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُو آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ**)[29] ئەگەر گوتبا وان خەلکێ پێغەمبەر بو هاتین بێژن (لا اله الا الله) (**يَسْتَكْبِرُونَ**) دا بێژن نەخێر تشتێن هوسا ناچێبن ئەم بتنێ گوهداریا خودێ ناکەین بەلکی گوهداریا خەلکەکێ دی ژی دێ کەین و لدیف هندەک تشتێن دیژی چین (**وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُو آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ**) ئایا ئەم خودایێت خو بهێلین بو شاعرەکێ دین کو محمدە !

توب خودێ ئەز دێ پرسیارەکێ کەم ئەو ئاخفتنێت ئەز دبێژم دنافا واقعیدا می هوسا نینە و هەمی نابێژنە من تو یێ دینی ! دێ بێژن ب خودێ ئەف زەلامە گەلەکێ دینە ئەفە ئەمریکا و ئەوروپا و ئەف تەکنەلوجیا یە و تو بەحسێ چ بومە دکەی ! زوربەیا خەلکی وەدبێژیتە مە و دێبێژنە مە ئەو چ ریهن تو یێ دینی.

**مەرجێ هەشتێ الکفر بما یعبدوا من دون الله :**

دفێت ژ خەیری خودێ چ کەسا نە پەرێسی- نە ئەفە بتنێ بەلکی دفێت کافر بی بوان ، الله تعالا دبێژیت : (**فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ**)[30] عروەتی وثقی (لا اله الا الله) یە ئانکو تە قایم دەست یێ گرتی ب (لا اله الا الله) فە ، ئەو دەمێ تو دبێژی من باوەری ب



28:سورة الذاريات اية : 56

29:سورة الصافات اية : 35-36

30:سورة البقرة اية : 256

هیچ خودایە کی نینە و هیچ رێنیشادەرەکی و شوێن کەفتیە کی کو خەلک د لدیف دچن نینە ژبلی الله نەبیت ، نە حیزب نە دار نە بەر نە عەلەم نە یێت ساخ نە یێت مری هەمی ل نک من د رەفز کرینە تنێ الله نەبیت .

ئەگەر وەنە بێژی و ل مالا خو برینیە خار و نفێژ و عیبادەتی بکەی و بێژی ئەز تنێ دێ نفێژ و عیبادەتێ خو کەم و من شولەپ خەلکی نینە و ئەز خەلکی ژی بکافر نا دانم کو الله و پێەمبەرێ وی ئەو بکافر دانابیت (صلی الله علیه وسلم) ، زانا دبێژن : بفێ ئایەتێ تو کافری . چونکی دفێت تو کافری ب کافر بدانی ، دفێت بێژیە کافری کافر نا چێبیت بێژی من عەلاقەت بێفە نینە.

هندەک نوکتەکێ دبێژن : کەسەک چو بو حەجێ و شەیطان رەجم دکر و دنافا خەلکی هوسا دبێژن بەس ئەم دبێژین ئەفە شەعیرەیە دفێت ئەو بەرە بچیتە لوی جهی تەواو لنک خەلکی هوسا دبێژن کو یێ شەیطانی رەجم دکەن ، و وی کەسی گوتی ئەی شەیطان والله من عەداوەت دگەل تە نینە بەس ئەفە چدکەن ئەززی وەدکەم و من هیچ پەیوەندی بفی کاریفە نینە .! نوکەژی هوسایە خەلک نفێژا دکەت ئەززی نفێژا دکەم و خلاس من پەیوەندی ب بابەتێن دیفە نینە ژبەر هندێ خودێ تعالا هوسا نابێژیت بەلکی ل قورئانا پروزدا دبێژیت : (**فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ**) مەرج یێ بو مە دانای کو دفێت تو کوفر ب تاغوتی بکەی ، بەرێ خوبدێ (**يَكْفُرْ**) ئانکو دفێت تو تەکفیری بیت تو بکافر بدانی یێ خودێ نە پەرێسیت و یێ خودێ ب پەرێسیت ودگەل هندێ هندەک تشتێن دی ژی بپەرێسیت و عیبادەتی بو بکەت ، ئەگەر تو بێژی ئەو کافر نینە تو بخو کافر دبی چونکی تە الله درەون دەرێخست جل وعلا.

الله تعالا دبێژیت : ئەوێ وەبکەت کافرە توژی بێژی نەخێر کافر نینە ئانکو لفێرێ تو کافری.

نوکە ئیمانا مە بفی شێوەیە : مە ئیمان ب الله و پێغەمبەری (صلی الله علی وسلم) هە یە و مە باوەری هەیە کو دینێ مە یێ راستە کو ژ قورئانێ یێ هاتی و هەمی دینێت دی ، یەهودی بیت یان نەصرانی بیت والله ئەگەر عیسا و موسا نوکە د ژیانێ دا بان و کار ب ئینجیل و تەوراتێ بکەن دێ کافربن ! ب نەصێ قورئانێ ئەفە ئاخفتنا من نینە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) یا گوتی ئەفە نەصا قورئانێ یە . الله تعالا وەعد یا ژ وان وەرگرتی د قورئانێ دا موسا و عیسا و فلان و فلان هەردەمێ محمد هات دفێت هین هەمی وی شەریعەتێ بهێلن و لدیف محمدی بچن(صلی الله علیه وسلم) و ئەگەر نە هین هەمی کافرن دفێت بێژن بەلێ یا الله مە قەبیل کر .

تو بخودێ ئەگە ر عیسا و موسا لنک خودێ کافرین فێجا ئەف مروفە چنە ل نک خودێ کو خەبەر و ئاخفتنا دبێنە خودێ و پێغەمبەرێ وی (صلی الله علیه وسلم) و کافر نەبن !! بەس بێژنە من بوچی ! ئانکو تو ژ خودێ برەحمتری ! نەخێر لنک خەلکی هەمی خەلک مسلمانە ، هەتاکو ندەک مەلایێت هەین دبێژن یەهودی و نەصرانی خودێ دپەرێسن مسلمانن ! تو گەلەکێ بێ عەقلی تو د قورئانێ تێنا گەهی کو خودێ تعالا دبێژیت : (**لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ**)[31] و الله کافرە پێ بێژیت خودێ سێنە ، ارێ هەمی دەما وەنا کەن کو دبێژن خودێ سێنە ! .

**اللهم صل علی محمد**



31:سورة المائدة اية : 73